بەشێک لە سوننەی عبداللّٰه

# پرسیار کراوە دەربارەی

# ئەوەی هاتووە لەسەر کورسی و دانیشتنی

# پەروەردگار(عَزَوَجَلَّ) لەسەری



بــەشێــك لە سوننەی عبدالله

پرسیار کراوە دەربارەی

# ئەوەی هاتووە لەسەر کورسی و دانیشتنی

## پەروەردگار عَزَوَجَلَّ لەسەری

زانا الكردي

ئامادەکردنی :

# پێشەکی

**بسم الله ، الحمدلله رب العالمين وصل الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم اما بعد :**

بەڕێزان لەم نامیلە بچوکەدا بابێکی کتابی [ السنة عبدالله بن أحمد بن حنبل ] ـمان کردووە بە کوردی بەناوی [ سُئِلَ عَمّا رُوِيَ فِي الكُرسي وجُلوسِ الرَّبِّ عَزَوَجَلَّ عليه ] واتە: ( پرسیار کراوە دەربارەی ئەوەی هاتووە لەسەر کورسی و دانیشتنی پەروەردگار(عَزَوَجَلَّ) لەسەری )، جا لەم بابەدا کورسی جێگیر دەرکرێ بۆ اللّٰە و جێگیری(الإستواء) دەکرێ بۆ اللّٰە واتە بەرزی اللّٰە تعالی بۆ سەر عەرش بە پێچەوانەی گروپە گومڕاکانی وەک [جەهمیەکان و موعتەزیلەکان و ئەشعەریەکان] کە ئینکاری ئەوە دەکەن کە اللّٰە لەسەر عەرش بێت بەڵکو دەڵێن اللّٰە لە هەموو شوێنێکە یان هیچ شوێنێکی نییە پەنا بە اللّٰە ئەمە کوفرێکی ئاشکرایە کە تێی کەوتوون اللّٰە پاکە لەوەی کە تێکەڵی دروستکراوەکانی بێت بەڵکو لەسەر عەرشەو جیایە لە دروستکراوەکانی و هەرگیز تێکەڵی دروستکراوەکانی نابێت ، جا لەم بابەدا ئیمام ئەو بەڵگانە دێنێ کە باس لە کورسی و دانیشتنی اللّٰە تعالی دەکات لەسەری ، وە ڕەدێکیشە بۆ ئەو گروپە گومڕایانە و بەرچاو ڕوناکیەکیشە بۆ ئەوانەی دەیانەوێت گوڕمڕا نەبن و لەسەر ڕێگەی ڕاست بن ، بەهیوای سوود بۆ هەموو لایەک و اللّٰە تعالی نیەتمان خالص بکات کە کارەکانمان تەنها لە پێناو خۆی بێت و دوربێ لە ڕیائي ، آمـــین.

**١- (٥٦٩) پرسیار کراوە دەربارەی ئەوەی هاتووە لەسەر کورسی و دانیشتنی پەروەردگار(عَزَوَجَلَّ) لەسەری ؟**

عبداللّٰه دەڵێ: باوکمم بینی ( رحمه اللّٰه ) ئەم فەرمووودانە و فەرمووودەکانی بینینی اللّٰه تعالی ـی بە صحیح دادەنا ، وە تێیدەپەڕاند ، وە کۆی دەکردنەوە لە ناو کتێبدا وە بۆی دەگێڕاینەوە تێیدا.

٢- (٥٧٠) باوکم بۆی گێڕامەوە ، ووتی: عبدالرحمٰن بۆی گێڕاینەوە ، لە سُفیان ، لە أبي إسحاق ، لە عبداللّٰه بن خلیفة ، لە عُمر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی: کاتێک اللّٰه تبارک وتعالی لەسەر کورسی دادەنیشێ ، دەنگێکی لێوە دەبیسترێ وەک دەنگی بارهەڵگرێکی تازە کە قورسایی دەچێتە سەر .

[مەبەست لە دەنگی کورسیە لەسەر عەرش ، کاتێک اللّٰه دادەنیشێ لەسەری دەنگی لێوە دێت دانیشتنی اللّٰه وەک دانیشتنی ئێمە نیە وە نایشوبهێنین بە خۆمان و چۆنیەتیەکەی نازانین ، چۆنیەتیەکەی تەنها اللّٰه خۆی دەزانێ ئێمە تەنها جێگیری دەکەین وەک ئەوەی کە هاتووە].

٣- (٥٧١) عبداللّٰه دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە ( ئیمامی أحمد ) ووتی وکیع بۆی گێڕاینەوە بە فەرمودەی: إسرائیل، لە إسحاق، لە عبداللّٰه بن خلیفة، لە عمر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی: کاتێ پەروەردگار عَزَوَجَلَّ لەسەر کورسی دادەنیشێت جالەکاتی وتنی پەروەردگار عَزَوَجَلَّ لەسەر کورسی دائەنیشێت پیاوێک پێی سەغڵەت بوو باوکم ناوی ئەو پیاوەی باسکرد لای وەکیع ، وکیع تورە بوو ، فەرمووی: ئەعمەش و سوفیانمان بینیوە ئەم فەرمودەیان گێڕاوەتەوە کەسیشیان ئینکاریان لێ نەکردووە.

٤- (٥٧٢) باوکم بۆی گێڕامەوە ، ووتی: وکیع بۆی گێڕاینەوە ، لە سُفیان ، لە عمَّار الدُّهني ، لە مُسلم البطِينِ ، لە سعید بن جُبیر ، لە ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما ) فەرمووی: کورسی جێگای هەردوو پێی اللّٰه یە ، وە هیچ کەسێکیش ئەندازەو گەورەیی عەرش نازانێ ئیللا اللّٰه خۆی نەبێ .

٥- (٥٧٣) باوکم بۆی گێڕامەوە ( ئیمامی أحمد ) ووتی: عبدالصَّمد بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: باوکم بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: محمد بن جُحادَةَ بۆی گێڕاینەوە ، لە سلمة بن کُهیل ، لە عُمارة بن عُمیر ، لە أبي موسی ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی: کورسی جێگای هەردوو پێی اللّٰه یە ، وە دەنگی لێوە دێت وەک دەنگی بارهەڵگرێک [ مەبەست لە دەنگی کورسیە کە پێشتر باسمان کرد ].

٦- (٥٧٤) باوکم بۆی گێڕامەوە ، ووتی: پیاوێک بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: إسرائیل بۆی گێڕاینەوە ، لە السُّدِّي ، لە أبي مالک دەربارەی وتەی اللّٰه عَزَوَجَلَّ: { وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ } [ البقرة ٢٥٥ ].

واتە: کورسی اللّٰه ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە .

فەرمووی: ئەو بەردەی لە ژێر زەوی حەوتەمەوەیە ، وە کۆتایی دروستکراوەکانیش لەوێیە چوار فریشتەی لێیە هەر یەک لەم فریشتانە چوار ڕویان هەیە: ڕویەکی مرۆڤە ، ڕویەکی شێرە ، ڕویەکی هەڵۆیە ، ڕویەکی گایە ، ئەوان لەسەری وەستاون ، وە دەوری زەوی و ئاسمانەکانیان داوە ، وە سەریان لە ژێر کورسیەکەیە ، وە کورسیەکەش لە لای عەرشەوەیە . وە دەڵێت کە قاچەکانی اللّٰه تبارک وتعالی دانراوە لەسەر کورسیەکە.

٧- (٥٧٥) عبدالله دەڵێ: العباس بن عبدالعظيم العنبري بۆی نوسیم: بەخەتی خۆی بۆی نوسیم: إسحاق بن منصور أبو عثمان بۆی گێڕاینەوە ،ووتی: إبراهيم بن يوسف بن أبي إسحاق بۆی گێڕاینەوە ، لە باوکیەوە ، لە عمَّار الدُّهني ، لە مُسلم البطين ، لە سعيد بن جُبير ، لە ابن عباس ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما ) فەرمووی: بەڕاستی کورسی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوەو جێگای قاچەکانی اللّٰه یە ، وە هیچ کەسێک ئەندازەو گەورەیی عەرش نازانێ ئیللا ئەوە نەبێت کە دروستی کردووە [واتە بەس اللّٰه دەزانێ گەورەیی عەرش چەندە] ، وە بەڕاستی ئاسمانەکان لە دروستکراوی ڕەحمان ـ جلَّ وعزَّ وەکو گۆمەزێکە لە بیابانێکدا [ واتە وەکو گۆمەزێک وایە لە چاو عەرش و کورسی ئەوەندە بچوکە ، واللّٰه اعلم ].

٨- (٥٧٦) باوکم بۆی گێڕامەوە ، ووتی: ابن مهدي و أبو سُفيان - واتە: المعمري ، بۆیان گێڕاینەوە ، لە سُفيان ، لە ليث ، لە مُجاهد ، فەرمووی: ئاسمانەکان و زەوی هیچ نییە لە چاو کورسی ئیللا وەک ئەنگوستیلەیەکە لە زەویەکی چۆڵدا.

٩- (٥٧٧) باوکم بۆی گێڕامەوە ، ووتی: نوح بن ميمون بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: گوێم لە بُكير بن معروف أبا مُعاذ قاضي نيسابور بوو ، لە مُقاتل بن حَيَّان ، لە الضَّحاك دەربارەی وتەی اللّٰه عَزَوَجَلَّ: { مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ } [ المجادلة ٧ ].

فەرمووی: ئەو(اللّٰه) لەسەر عەرشەکەیەتی ، وە بە زانستی لەگەڵیانە [ واتە ئاگای لێیانە هەرچیەک بکەن ].

١٠-(٥٧٨) عبدالله دەڵێ: عباسُ بن عبدالعظيم العنبري بۆی نوسیم: أبو أحمد الزُّبيري بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: إسرائيل بۆی گێڕاینەوە ، لە أبي إسحاق ، عن عبدالله بن خليفة ، ووتی: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر { ﷺ } پێی ووت: داوا بکە لە اللّٰه کە بمخاتە بەهەشتەوە .

فەرمووی: پەروەردگار عَزَوَجَلَّ گەورەترینە ، وە فەرمووی:

{ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ } [ البقرة ٢٥٥ ]

واتە: کورسی اللّٰە ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە .

کاتێک اللّٰە دادەنیشێ لەسەری [کورسی] جلَّ وعزَّ ، جێگا نامێنێ ئیللا هێندەی چوار پەنجە نەبێت ، وە ئەو دەنگێکی هەیە وەک دەنگی بار هەڵگرێک کاتێک سەردەکەوی و قورسایی دەچێتە سەر [ مەبەست لە دەنگی کورسیە کە لەسەر عەرشە].

١١- (٥٧٩) محمد بن علي بن الحسن بن شقيق بۆی گێڕامەوە ، ووتی: إبراهيم بن الأشعث بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: گوێم لە الفُضيل بن عِياض دەیوت:

ئەهلی ئیرجاء دەڵێن: ئیمان وتەیە بەبێ کردەوە.

وە جەهمیەکان دەڵێن: ئیمان ناسینە بەبێ وتە و بەبێ کردەوە.

وە ئەهلی سوننە دەڵێن: ئیمان ناسینە ، وە وتەیە ، وە کردەوەشە.

١٢- (٥٨٠) أبو مَعمر بۆی گێڕامەوە ،ووتی: نوح بن ميمون المضرُوب ، وە سلم بن سالم بۆیان گێڕاینەوە ، لە بُكير بن مَعروف ، لە مُقاتل بن حيَّان ، لە عكرمة ، لە ابن عباس ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما ) دەربارەی ئایەتی: { وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ } [ الحديد ٤ ].

فەرمووی: ئاگادارە بە حاڵتان لە هەرکوێیەکدا بن.

ثم حدثنا به أبو مَعمر مرَّةَ أُخرى ، فرجعَ عنه ، وقال: هو عن الضَّحاك.

١٣- (٥٨١) أحمد بن سَعيد الدَّارمي بۆی گێڕامەوە ، ووتی: گوێم لە باوکم بوو، گوێم لە أبا عِصمَةَ بوو ، وە پیاوێک پرسیاری لێ کرد دەربارەی اللّٰه عَزَوَجَلَّ ئەو لە ئاسمانە ؟

أبا عِصمَةَ ، فەرمودەکەی پێغەمبەری { ﷺ } گێڕایەوە کاتێک پرسیاری لە ئافرەتە جاریەکە کرد: اللّٰه لە کوێیە ؟

ووتی: لە ئاسمانە.

فەرمووی: ئەی من کێم ؟

ووتی: تۆ رسول اللّٰه ی ( واتە نێردراوی اللّٰه ).

فەرمووی: ئازادی بکەن ئەوە ئیمانداره.

أبا عِصمَةَ فەرمووی: رسول اللّٰه { ﷺ } ناوی لێنا ئیماندار کاتێک زانی کە اللّٰه تعالی لە ئاسمانە [واتە گەر نەزانێ اللّٰه تعالی لە ئاسمانە لەسەر عەرش ئەوە ئیماندار نییە].

١٤- (٥٨٢) أحمد بن إبراهيم الدَّورَقي بۆی گێڕامەوە ، ووتی: علي بن الحسن بن شقيق بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: عبداللّٰه بن موسى الضَّبِّي بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: معدان بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: پرسیارم لە سُفيان الثوري کرد دەربارەی وتەی اللّٰه عَزَوَجَلَّ: { وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ } [ الحديد ٤ ]. فەرمووی: زانستەکەی [واتە اللّٰه تعالی لەسەر عەرشەو زانستی لە هەموو شوێنێکە].

١٥- (٥٨٣) أحمد بن إبراهيم بۆی گێڕامەوە ، ووتی: علي بن الحسن بۆی گێڕاینەوە ووتی: ابن المُبارك ووتی: ئەگەر کەسێک لە خوراسان هەبێت لە جێگری زانایان: ئەوە معدان ـە ، ووتی: پرسیارم لە سُفيان الثوري کرد دەربارەی وتەی اللّٰه عَزَوَجَلَّ: { وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ } [ الحديد ٤ ].

فەرمووی: زانستەکەی.

١٦-(٥٨٤) أحمد بن إبراهيم بۆی گێڕامەوە ، ووتی: علي بن الحسن بۆی گێڕاینەوە ووتی: پرسیارم لە عبداللّٰه بن المُبارک کرد: چۆن پێویستە پەروەردگارمان بناسین ؟

عبداللّٰه بن المُبارک فەرمووی: بەوەی لە سەروو ئاسمانی حەوتەمە لەسەر عەرشەکەی ، وە هەمان قسەی جەهمییەکان ناڵێین کە دەڵێن ئەو لێرەیە : واتە: لەزەوییە [ جەهمیەکان دەڵێن اللّٰه لە هەموو شوێنێکە ، ئەمەش کوفرە پەنا بە اللّٰه ].

سەرچاوە ( السنة عبداللّٰه ).

